# بالاپۆشی ئافرەتانی موسڵمان

ناوی نووسەر : هونەر بەرزان مصطفى

هونەر بەرزان مصطفى
کەلار – گەرمیان
١٨شەعبان/١٤٤٣

# باڵاپۆشی ئافرەتانی موسڵمان

## ( پێشەکی )

بەناوی خوای داپۆشەری پارێزەر ، وە درود و پیرۆزی خوا بڕژێتە سەر کۆتا پەیامبەر ، وە لەسەر خێزان و هاوەڵ و شوێنکەوتووانی بە گشتی ، بەڵام دواتر:

باڵاپۆشی یەکێکە لە دروشمە گەورەکانی ئیسلام ، وە جیاکەرەوەی ئافرەتی موسڵمانە لە ئافرەتی بێباوەڕان ، وە یەکێکە لەو کارانەی کە بێگومان پێویست کراوە لەسەر ئافرەتان ، وە هەڕەشەش کراوە لەسەر نەکەرانی.

جا لە سەروبەندی ئەم گێژاوەی ئێستاکە موسڵمانان تێیدا دەژین ، ئەم هەموو هەوڵ و کۆششە بۆ داکەندنی پۆشاک لەبەری ئافرەتانی موسڵمانان بەناوی ئازادی و پێشکەوتن و (مۆد)ـەوە ، کە بە ملیاران دۆلار و یۆرۆ خەرج دەکرێت بۆ ئەو مەبەستە ، پێم باش بوو بابەتێک بە تێر و تەسەلی ئامادە بکەم لەسەر باڵاپۆشی ، ئەمەش بە باسکردنی واتاکەی ، وە حوکمەکەی ، وە شێوازەکەی ، تاکو دایکان و خوشکانمان وشیار و بەئاگا بن لەم بابەتە و فەرمانەکەی خوا و پەیامبەرەکەی ( صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) بە جوانی وەکو خۆی جێبەجێ بکەن.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی : (يَابَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنْزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا )[١] .

واتە : (ئەی نەوەکانی ئادەم با شەیتان فریوتان نەدات هەروەکو چۆن باوک و دایکتانی فیرودا و لە بەهەشت دەری کردن و پۆشاکی بەریانی داماڵی تاکو شەرمەندامیان پێشیانی یەکتریان بدات).

---

١- (الأعراف : ٢٧).

خۆداپۆشین هەر لە سەرەتای دروست کردنی مرۆڤەوە بۆتە بەشێکی دانەبڕاوەی مرۆڤ ، وە مرۆڤەکان لە ئاژەڵان جیا دەکاتەوە ، وە شەیتانیش ئەیەوێت ئەو جیاکەرەوەیە نەهێڵێت و مرۆڤەکان بباتە ڕیزی ئاژەڵان بە داماڵینی پۆشاکی بەریان ، جا لەم پرسەشدا ئەوەی شەیتانە مرۆییەکان پێی هەڵئەسن بە شەیتانە جنۆکەییەکان ناکرێت !!!.

شەیتانە مرۆییەکان جاران تەنیا بریتی بوون لە (مولحید) و (عەلمانی)یەکان ، کەچی ئێستا هەندێ بەناو مەلاش چوونەتە ڕیزیانەوە و دژی باڵاپۆشی وەستاونەتەوە !!!.

جا بە ویستی خوا بابەتە لە ماوەی شەش بەشدا ڕوونی ئەکەینەوە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکان ، وە لە کۆتایشدا هەندێک گفتوگۆ لەسەر هەندێ بابەتی گرنگ ئەکەین کە پەیوەستە بە باڵاپۆشییەوە.

## (واتای باڵاپۆشی (الحجاب) لە ڕووی زمانەوانی و شەرعیشەوە)

لە قورئان و سوننەتدا چەندان دەستەواژە هاتوون کە واتای باڵاپۆشی ئەدەن وەکو دەستەواژەکانی (الحجاب) و (الجلباب) و (الخمار) و (النقاب).

جا ئەو دەستەواژانە بێگومان عەرەبین ، بۆیە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە عەرەبییەکان بۆ واتاکردنیان.

١- (الحجاب) بە واتای (الستر) داپۆشەرە ، وە (کل ما حال بین شیئین) واتا (الحجاب) هەر شتێکە کە ببێتە بەربەست لە نێوان دوو شتدا ، وە (وکل شيء منع شیئا) واتا (الحجاب) هەر شتێکە کە ببێتە ڕێگر لە شتێکی تر [٢].

کەواتە (الحجاب) بەو پۆشاکە ئەوترێت کە ببێتە بەربەست و ڕێگر لە نێوان دەرکەوتنی جەستەی ئافرەت و بینینی چاوی پیاو ، هەر بۆیە زانایانی شەرع پێناسەیان کردووە بە (ستر زینة المرأة) داپۆشینی جوانی ئافرەت.

٢- (الجلباب) : القمیص، الجلباب: ثوب أوسع من الخمار دون الرداء تغطي به المرأة رأسها وصدرها، وقیل: هو ثوب واسع دون الملحفة، تلبسه المرأة، وقیل: هو الملحفة، وقیل هو ما تغطي به المرأة الثیاب من فوق کالملحفة، وقیل: هو الخمار، وقالت العامریة: الجلباب : الخمار، وقیل: جلباب المرأة ملاءتها التي تشتمل بها ، (وقال) ابن الأعرابي: الجلباب : الإزار، قال الأزهري: معنی قوله... : یجلل جمیع الجسد، وقیل: هو کالمقنعة تغطي به المرأة رأسها وظهرها وصدرها [٣].

---

٢- (لسان العرب : ٤/٣٦).

٣- (لسان العرب : ٣/١٧٠).

واتە : (الجلباب) کراسە ، (الجلباب) پۆشاکێکی فراوانترە لە (الخمار) بەبێ (الرداء) کە ئافرەت سەر و سینگی پێ دادەپۆشێت ، وە وتراوە : پۆشاکێکی فراوانە بەبێ (الملحفة ) ، وە وتراویشە (الجلباب) بریتییە لە (الخمار) ، وە عامرییە وتوویەتی : (الجلباب) بریتییە لە (الخمار) ، وە وتراویشە : (الجلباب)ی ئافرەت (الملاءة )ـەکەیەتی کە تێکڕای جەستەی دەگرێتەوە ، وە ئیبن ئەعڕابی وتوویەتی : (الجلباب) بریتییە لە (الإزار) ، وە ئەزهەریش وتوویەتی : واتای وتەکەی ئیبن ئەعڕابی ئەوەیە کە : تێکڕای جەستە داپپۆشێت ، وە وتراویشە : وەکو (المقنعة )ـەیە کە ئافرەت سەر و پشت و سینگی پێ دادەپۆشێت.

ئێستا دێین ئەو دەستەواژانەی کە هەر بە عەرەبییەکەی دامناون واتایان دەکەین:

(الرداء) : بە واتای ئەو پۆشاکە دێت کە لە سەرەوەی پۆشاکی تر دەپۆشرێت ، وەکو جوبە و چارشێو ، وە بە واتای پۆشاکی بەشی سەرەوەی جەستەش دێت کە سەر شانەکان تاکو کەمەر داپۆشێت ، وەکو کراس و پاڵتاو و چاکەت.

(الملحفة ) : بە هەر داپۆشەرێک ئەوترێت کە جەستەی پێ داپپۆشرێت.

(الملاءة ) : بە واتای ئەو پۆشاکە دێت کە یەک پارچەیە و باڵەکانی تێ دەخرێت ، وەکو دشلالە و ڕۆبە و چارشێو.

(الإزار) : بە واتای ئەو پۆشاکە دێت کە بەشی خوارەوەی جەستە دادەپۆشێت لە کەمەرەوە تاکو پێیەکان ، وەکو شەواڵ و تەنورە.

(المقنعة ) : بە واتای ئەو پۆشاکە دێت کە بەشی سەر دادەپۆشێت ، کە بە کوردی پێی ئەوترێت تارا و لە ناو خەڵکیش بە (نیقاب) ناسراوە.

کەواتە (الجلباب) بەو پۆشاکە ئەوترێت کەلە تەوقی سەرەوە تاکو پێیەکان داپپۆشێت بەبێ دەرکەوتنی هیچ بەشێکی جەستە.

**٣- (الخمار) : والخمار المرأة وهو النصيف، وقيل: الخمار ما تغطي به المرأة رأسها، أرادت بالخمار العمامة لأن الرجل يغطي بها رأسه كما أن المرأة تغطيه بخمارها، وكل مغطي: مخمر[٤].**

**واتە : (الخمار)ى ئافرەت بریتییە لە (النصیف) ، وە وتراویشە (الخمار) ئەو پارچەیەیە کە ئافرەت سەری خۆی پێ دادەپۆشێت ، مەبەستیش لە (الخمار) پێچەیە چونکە پیاو سەری بە پێچە دەپێچێتەوە وەکو چۆن ئافرەت سەری دادەپۆشێت بە (الخمار)ـەکەی ، وە گشت داپۆشراوێک : (الخمار)ـە.**

**کەواتە (الخمار) بەو پۆشاکە ئەوترێت کە بەشی سەر دادەپۆشێت.**

**(النقاب) : والنقاب: القناع على مارن الأنف، والنقاب على وجوه، قال الفراء: إذا أدنت المرأة نقابها إلى عينها فتلك الوصوصة، فإن أنزلته دون ذلك إلى المحجر فهو النقاب، فإن كان على طرف الأنف فهو اللفام[٥].**

**واتە : وە (النقاب) : ئەو تارایەیە کە لەسەر دوولای لوتە ، وە (النقاب) لەسەر ڕوومەتە ، فەڕاء وتوویەتی : ئەگەر ئافرەت (النقاب)ـەکەی لابدات لەسەر چاوی ئەوا ئەوە (الوصوصة )ـەیە ، ئەگەر لاشی بدات بۆ خوارتر لەوە تاکو دەوری چاوی ئەوا (النقاب)ـە ، ئەگەریش لەسەر کناری لوت بێت ئەوا ئەوە (اللفام)ـە.**

**(الوصوصة ) : بەو (النقاب)ـە ئەوترێت کە ڕوومەت دائەپۆشێت تەنیا چاوەکان نەبێت .**

**(اللفام) : بەو (النقاب)ـە ئەوترێت کە لوت و لەبەلاکانی لوت دادەپۆشێت.**

**کەواتە (النقاب) بەو پۆشاکە ئەوترێت کە بەشی ڕوومەت دادەپۆشێت جا بە چاوەکانیشەوە بێت یان بەبێ چاوەکان.**

---

٤- (لسان العرب : ١٥٤/٥).
٥- (لسان العرب : ٣٣٢/١٤).

**٥- (الثوب) : الثوب: اللباس، والثياب اللباس[٦].**

**واتە : (الثوب) پۆشاکە.**

**بۆیە ئەوەی دەپۆشرێت و لەبەر دەکرێت پێی ئەوترێت (الثوب).**

**٦- (سدل) : الثوب والستر والشعر، سدلا، ارخاه وأرسله[٧].**

**واتە : (سدل) : پۆشاک و داپۆشەرە ، (سدلا) واتا بەریدایەوە و شۆڕی کردووە.**

**کەواتە (سدل) پۆشاکێکە بەردەدرێتەوە و شۆڕ دەکرێتەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە.**

**٧- (مرط) : كساء من خز أو صوف أو كتان يؤتزر به وتتلفع به المرأة[٨].**

**واتە : چارشێوێکە لە ئاوریشم یان خوری یان کەتان دروست دەکرێت ، ئافرەتان خۆیانی پێ دەپێچنەوە.**

---

**٦- (لسان العرب : ٥٢/٣).**

**٧- (المعجم الوسيط : ٤٤١).**

**٨- (المعجم الوسيط : ٩٨٩).**

## (حوکمی باڵاپۆشی له ئایەتەکاندا)

پەروەردگار له چەندان ئایەتدا فەرمانی به ئافرەتانی موسڵمان کردووه خۆیان داپۆشن و جەسته و باڵای خۆیان بەدەر نەخەن بۆ نامۆکان ، ئەو ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر پێویستی (واجب)ێتی باڵاپۆشی (الحجاب).

### بەڵگەی یەکەم /

پەروەردگار فەرموویەتی : (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)[٩].

واته : (وه ئەگەر داوای شتێکتان له هاوسەرانی پەیامبەر کرد ئەوا له پشتی پەردەوه داوایان لێ بکەن ، ئەمەش پاکتره بۆ دڵی ئێوه و ئەوانیش).

### ڕاڤه و شرۆڤەی ئایەتەک /

پێشەوا (أنس بن مالک) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەی : ((کاتێک زەینەب درا به پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خواردنێکی دروست کرد و خەڵکی بانگهێشت کرد ، ئەوانیش هاتن لەو کاتەدا زەینەب له ماڵەوه بوو لەگەڵ پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، دەستیان کرد به گفتوگۆی خۆیان ، وه پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەردەچوو وه دەگەڕایەوه ژوورەوه ئەوانیش دانیشتبوون ، ئەنجا ئایەتەکه دابەزی ، ئەوانیش هەستان و پەردەیەکیان له نێوان خۆیان ، زەینەب دانا))[١٠].

---

٩- (الأحزاب : ٥٣).

١٠- (تفسیر الطبري)

هەروەها (أنس بن مالک) کە ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە بۆ (طلحة) ئەویش ئەفەرمێت : ((گەر وا بێت ئەوا ئایەتی لەسەر دادەبەزێت)) ، (انس)یش ئەفەرمێت : ((دوای ئەوە ئایەتی باڵاپۆشی دابەزی))[11].

پێشەوا (القتادة) لە شرۆڤەی ئایەتەکەدا فەرموویەتی : ((لە هاوەڵانەوە پێمان گەشتووە کە لەو ئایەتەدا فەرمانی باڵاپۆشی کراوە لە ئافرەتان))[12].

گەر بیرتان بێت وتمان (الحجاب) بەو پۆشاکە ئەوترێت کە ببێتە بەربەست و ڕێگر لە نێوان دەرکەوتنی جەستەی ئافرەت و بینینی چاوی پیاو ، وە داپۆشینی جوانی ئافرەتە ، وە جوانی ئافرەت زیاتر لە ڕوومەتی ئافرەت دەبینرێت وەک لە بەشەکانی تری جەستەی ، هەر بۆیە (أنس) فەرمووی : ((ئەوانیش هەستان و پەردەیەکیان لە نێوان خۆیان ، زەینەب دانا)) ، ئەمە تاکو بە هیچ شێوەیەک (زینب) نەبینن بە ڕوومەتیشیەوە.

**بەڵگەی دووەم /**

پەروەردگار فەرموویەتی : (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ)[13].

واتە : (ئەی نێردراو بە هاوسەر و کچەکانت وە بە ئافرەتی باوەڕدارانیش بڵێ چارشێوەکانیان شۆڕ بکەنەوە بەسەر تێکڕای جەستەیان ، ئەمەش باشترە لەوەی بناسرێنەوە تاکو ئازار نەدرێن).

---

١١- (تفسير الطبري)

١٢- (تفسير الطبري)

١٣- (الأحزاب : ٥٩).

## ڕاڤە و شرۆڤەی ئایەتەکە /

پێشەوا (الطبري) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((ئەی نێردراو بە هاوسەر و کچەکانت وە بە ئافرەتی باوەڕدارانیش بڵێ با خۆیان نەچوێنن بە کەنیزەکەوە لە پۆشاکەکانیاندا کاتێک بۆ پێویستی خۆیان لە ماڵەوە دەرچوون بەوەی قژ و ڕوومەتیان دەربخەن ، بەڵکو با بە چارشێوەکایان قژ و ڕوومەتیان داپۆشن ، تاکو خراپەکار ڕێگەیان لێ نەگرێت))[١٤].

پێشەوا (ابن عباس) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((خوا فەرمانی کردووە بە ئافرەتانی موسڵمانان کە ڕوومەتی خۆیان داپۆشن بە چارشێوەکانیان کاتێک لە ماڵەکانیان دەردەچن بۆ پێویستییەک))[١٥].

وە (أم سلمة) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((کاتێک ئایەتی (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ) دابەزی ئافرەتانی پشتیوانن (الأنصار) کە لە ماڵەوە دەرچوون وەک بڵێی قەلەڕەش بەسەریانەوەیە بەهۆی ئەو پۆشاکەی کە بەستبوویان بەسەریانەوە))[١٦].

(جَلَابِيب) کۆی (الجلباب)ـە ، گەر بیرتان بێتەوە وتمان (الجلباب) بەو پۆشاکە ئەوترێت کەلە تەوقی سەرەوە تاکو پێییەکان داپپۆشێت بەبێ دەرکەوتنی هیچ بەشێکی جەستە.

---

١٤- (تفسير الطبري)

١٥- (تفسير الطبري) و (تفسير ابن كثير)

١٦- (تفسير ابن كثير)

## بەڵگەی سێیەم /

پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾[١٧].

واتە : (با ئافرەتانی باوەڕدار جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی خۆی بەدەر کەوتووە ، وە با پێچە و لەچکەکانیان شۆڕ بکەنەوە و بیدەن بەسەر سینگ و ملیاندا).

## ڕاڤە و شرۆڤەی ئایەتەکە /

پێشەوا (الطبري) (بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت) فەرموویەتی : ((با پێچە و لەچکەکانیان شۆڕ بکەنەوە تاکو قژ و مل و گوێیەکانیان پێی دا پۆشن))[١٨].

وە دایکمان (عائشة) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((يَرْحَمُ اللَّهُ نِسَاءَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلَ " لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ : (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ ، فَاخْتَمَرْنَ بِهَا))[١٩].

واتە : ((خوا بەخشندەیی خۆی بڕێژێتە سەر ئافرەتانی کۆچبەرانی سەرەتا چونکە کاتێک خوا ئایەتی (با پێچە و لەچکەکانیان شۆڕ بکەنەوە و بیدەن بەسەر سینگ و ملیاندا) پارچەیەکیان لە خوارەوەی پۆشاکەکانیان کردەوە و خۆیانیان پێ دا پۆشی)).

---

١٧- (النور : ٣١).

١٨- (تفسير الطبري).

١٩- (البخاري : ٤٧٥٨).

**پێشەوا (ابن حجر) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((وتەی (فَاخْتَمَرْنَ بِهَا) واتا ڕوومەتیان پێی داپۆشی ، وە شێوازی ئەمەش ئەوەیە کە لەچکەکە بخاتە سەریەوە ، وە لەلای ڕاستییەوە بەریداتەوە بۆلای شانی چەپی کە ئەمەش تارایە))[٢٠].**

**لە پێناسەی (الخمار) وتمان بەو پۆشاکە ئەوترێت کە بەشی سەر دادەپۆشێت ، بەڵام لێرەدا (ابن حجر) فەرموویەتی واتا ڕوومەتیان پێی داپۆشی ، کۆبەندی لە نێون ئەم دوو وتەیە ئەوەیە کە ڕوومەتیش بەشێکە لەسەر ، هەروەها (الخمار) بە هەر شتێک ئەوترێت کە شتێکی داپۆشیبێت هەربۆیە وتمان (وکل مغطي: مخمر) گشت داپۆشراوێک : (الخمار) کراوە ، جا کە ڕوومەتیش دادەپۆشرێت ئەوا (الخمار) کراوە ، هەروەکو چۆن بە سپیکار دیوار ئەوترێت (مخمر) ئەم وتەیە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە کە مەبەست پێی داپۆشینی تەواوی دیوارەکەیە بە گەچ ، جا داپۆشینی تەواوی ڕوومەتیش خۆی لە خۆیدا (مخمر)ـە.**

---

٢٠- (فتح الباري : ٦٢١/٨).

## بەڵگەی چوارەم /

پەروەردگار فەرموویەتی : (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ)[٢١] .

واتە : (وە با جوانی خۆیان دەرنەخەن تەنیا بۆ مێردەکانیان نەبێت ، یان بۆ باوکیان نەبێت ، یان بۆ خەزوریان نەبێت ، یان بۆ کوڕی خۆیان یان کوڕی مێردەکانیان نەبێت ، یان بۆ براکانی خۆیان نەبێت ، یان بۆ کوڕی برا و خوشکەکانیان نەبێت ، یان بۆ ئافرەتان نەبێت ، یان بۆ کەنیزەکەکانیان نەبێت ، یان بۆ ئەو پیاوانە نەبێت کە سەربە ماڵەوەی خۆیانن و ئارەزوویان لە دەست داوە ، یان منداڵێک کە پێنەگەشتووە بۆ سەیرکردنی ئافرەتان ، وە با ئافرەتان پێیان نەدەن بە زەویدا تاکو دەنگی پاوەن و پێڵاوەکانیان دەرچێت و بەوەش جوانی خۆیان دەرخەن).

## ڕاڤە و شرۆڤەی ئایەتەکە /

پێشەوا (الطبري) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) ئەوەیە کە دیار نییە ، بەڵکو شاراوەیە ، وەکو پاوەند و گوارە و قوڵبەند ، وە گشت ئەو شوێنانەشە کە فەرمان کراوە داپۆشرێت بە تاراکەی لە سەرووی کراسەوە)[٢٢] .

---

٢١- (النور : ٣١).

٢٢- (تفسير الطبري).

هەروەها پێشەوا (ابن عباس) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((ئەو جوانییەی کە بۆیان هەیە دەری بخەن بۆ ئەو کەسانە : گوارە و ملوانکە و بازنگەکانیانە ، بەڵام پاوەند و قۆڵبەند و مل و قژی دەری ناخات بۆ هیچ کەسێک تەنیا مێردەکەی خۆی نەبێت))[٢٣].

جا سەرنجی کۆتایی ئایەتەکە بدەن (وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ) ، لێرەدا پەروەردگار یاساغی دەکات لە ئافرەتان لەوەی بە شێوازێک ڕێ بکەن کە پێیان توند بدەن بە زەویدا ، ئەمەش بۆ ئەوەی دەنگی پاوەن و پێڵاوەکانیان نەیەت ، چونکە ئەو دەنگە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی ڕەگەزی بەرامبەر بۆیان ، وە خوای گەورە ئەم کردارەشی ناوناوا (زينة) جوانی ئافرەت (زِينَتِهِنَّ) ، دەی چجای جوانی ڕوومەتی ئافرەتان ؟! ، گەر ئەم کردارە قەدەغە بێت ئەوا بێگومان دەرخستنی ڕوومەت زیاتر و زۆرتر قەدەغەیە لە ئیسلامدا.

**بەڵگەی پێنجەم /**

پەروەردگار فەرموویەتی : (وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ)[٢٤] .

واتە : (وە ئەو پیرەژنانەی کە بێئومێد بوون لە هاوسەرگیری ئەوا تاوانبار نابن گەر هەندێک لە پۆشاکەکانیان لابەرن بەڵام بەبێ دەرخستنی جوانییان ، خۆ گەر لاشی نەبەن و بیهێڵنەوە ئەوا باشترە بۆیان).

---

٢٣- (تفسير الطبري).

٢٤- (النور : ٦٠).

پێشەوا (الطبري) فەرموویەتی : ((واتا تاوانبار نابن گەر (الجلباب)ەکانیان لابەرن کە تاراکەیانە و لەسەری (الخمار)ەوەیە ، وە چارشێوەکانیان کە لە سەر پۆشاکەوەیە ، بە لابردنی تاوانبار نابن لەلای (مەحرەم)ەکانی خۆیان ، وە لەلای بێگانەکانیش بەڵام بەبێ درخستنی جوانی))[٢٥].

سەرنج بدەن خوای گەورە ڕێگەی داوە بە ئافرەتانێک کە هێندە بەتەمەن و پیر بوونە ئیتر بە تەمای هاوسەرگیری نین و لە سوڕی مانگانە کەوتوون و پیاوان بەبینیان ئارەزوویان بۆیان ناچێت و ئەوانیش هەروەها بەرامبەر بە پیاوان ، ئەوسا بۆیان هەیە ڕوومەتی خۆیان دەربخەن ، سەرەڕای ئەوەش لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەفەرمێت گەر (الجلباب)ەکەشیان لا نەبەن ئەوا باشترە بۆیان ، دەی چجای ئافرەتێکی گەنج یان جوان ! ، بێگومان ئەمان لە پێشترن بۆ ئەو باڵاپۆشییەوە.

پێشەوا (عاصم الأحول) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ئێمە کە ئەچووین بۆ ماڵی حەفسەی کچی سیرین بە (الجلباب)ەکەی ڕوومەتی داپۆشیبوو ، ئێمەش وتمان : خوا لێت خۆش بێت مەگەر خوا نافەرمێت : (وە ئەو پیرەژنانەی کە بێئومێد بوون لە هاوسەرگیری ئەوا تاوانبار نابن گەر هەندێک لە پۆشاکەکانیان لابەرن بەڵام بەبێ خۆ ڕووت کردنەوە و دەرخستنی جوانی ؟!).

فەرمووی : ئەی دوای ئەوە چی ئەفەرمێت ؟!.

وتمان : (خۆ گەر لاشی نەبەن و بیهێڵنەوە ئەوا باشترە بۆیان).

فەرمووی : دەی ئەوە بەڵگەیە لەسەر (الجلباب)[٢٦].

---

٢٥- (تفسير الطبري).

٢٦- (صفة الصفوة : ٢/٢٤١).

**ئافرەتانی پێشینی چاک بەو جۆرە بوون خوشک و دایکەکانم دەی ئێوەش وابن ، تەنانەت بە پیری و پەککەوتوویش ڕوومەتی دەرنەخستووە لە کاتێکدا ڕەوایە بۆی دەری بخات لەو قۆناغەی ژیانی بەلام نایکات و بەدوای چاکتر و باشترەوەیە لە پاداشتی پەروەردگار.**

## بەڵگەی شەشەم /

**پەروەردگار فەرموویەتی : (وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى)[٢٧] .**

**واتە : (لە ماڵەکانی خۆتاندا جێگیر و نیشتەجێ بن ، جوانی خۆتان دەرمەخەن وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی پێشوو) .**

**وشەی (تَبَرُّجَ) چەند شرۆڤەیەکی بۆ کراوە:**

**١- ڕۆشتن بە لەنجەولار : ئەمەش بۆچوونی پێشەوا (قتادة) و (مجاهد)ـە.**

**٢- ڕۆشتن بە پێشی پیاوان : ئەمەش بۆچوونی پێشەوا (مجاهد)ـە.**

**٣- ڕۆشتن بە لوتبەرزییەوە : ئەمەش بۆچوونی پێشەوا (ابن أبي نجيح)ـە.**

**٤- لادانی (الخمار)ـە : ئەمەش بۆچوونی پێشەوا (مقاتل)ـە.**

**٥- بەدەرخستنی جوانی : ئەمەش زۆرێک لە (مفسرين) ئاماژەیان پێداوە وەکو (الطبري) و (البغوي) و جگە لەمانیش.**

---

٢٧- (الأحزاب : ٣٣).

جا گشت ئەوانە ڕاستن وە بۆ یەک مەبەست ئەگەڕێنەوە ، ئەویش دەرنەکەوتنی جوانی ئافرەتانە ، چونکە لەنجەرولاری لە خووە جوانەکانی ئافرەتە ، هەروەها ڕوومەتیش لە جوانترین بەشە جەستەی ئافرەتە ، وە تێپەڕ بوونیشیان بە پێش پیاوانی بێگانە بە لوت بەرزییەوە بێت یان نا کارێکی خراپە ، بۆیە نەکردنی ئەو کارانە واتە دەرنەخستنی جوانی.

پێشەوا (القرطبي) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێک ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ئەوەندە دەگریا تاکو (الخمار)ـەکەی تەڕ دەبوو))[٢٨].

---

٢٨- (تفسير القرطبي).

## (حوکمی باڵاپۆشی لە فەرموودەکاندا)

لە چەندان فەرموودەدا ئاماژە کراوە بە پێویستی (واجب)ی باڵاپۆشی کە بە ویستی خوا دەیانگێڕینەوە.

**بەڵگەی یەکەم /**

**عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ، قَالَتْ : أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه (صَلَى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَمَ) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى " الْعَوَاتِقَ، وَالْحُيَّضَ ، وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلَاةَ، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ، وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِحْدَانَا لَا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ. قَالَ : ((لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا))[29].**

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (أم عطية)وە کە فەرموویەتی : پەیامبەری خوا (**صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ**) فەرمانی پێ کردین کە کچانی تازەپێگەشتوو وە ئەو ئافرەتانەی کە لە سوڕی مانگانەدان وە ئەو کچانەی کە لە ماڵەوە دەرنەئەچوون لە ماڵەکانیان دەریان بێنین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان ، بەڵام ئەو ئافرەتانەی کە لە سوڕی مانگانەدان با نوێژەکانیان نەکەن ، بەڵام با لە پاداشتی گوێگرتن لە وتارەکە و نزای باوەڕداران ئامادە بن ، وتم ئەی پەیامبەری خوا یەکێکمان (جلباب)ی نییە ، فەرمووی : ((با خوشکەکەی یەکێک لە (جلباب)ەکانی خۆی پێبدات بیپۆشێت)).

لێرەدا دەردەکەوێت ئافرەتانی پەیامبەری خوا (**صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ**) و هاوەڵان بە هاوسەر و کچ و کیژۆڵەکانیشیانەوە (جلباب)یان دەپۆشی ، چونکە (الْعَوَاتِقَ) کۆی (العاتق)ە واتە ئەو کیژۆڵەیەی کە پێنەگەشتووە و وا نزیک بۆتەوە لە پێگەشتن یان تازە پێگەشتووە ، وتیشمان (الجلباب) ئەو پۆشاکەیە کە تەواوی جەستە دادەپۆشێت.

---

٢٩- (البخاري : ٣٥١ ، مسلم : ٨٩٠).

## بەڵگەی دووەم /

**عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : ((كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) مُحْرِمَاتٌ ، فَإِذَا حَاذَوْا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا عَلَى وَجْهِهَا، فَإِذَا جَاوَزُونَا كَشَفْنَاهُ))[٣٠].**

**واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (عائشة) کە فەرموویەتی : ((پیاوان بەلاماندا تێپەڕ دەبوون کاتێک ئێمە لە (ئیحرام)دا بووین لەگەڵ پەیامبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ)دا بووین ، جا کاتێک ڕووبەڕوومان دەبوونەوە هەر یەکێکمان (جلباب)ەکەی لەسەریەوە بەردەدایەوە بەسەر ڕوومەتی ، جا کە تێپەڕ ئەبوون لامان دەدایەوە)).**

**ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر پێویستی داپۆشینی ڕوومەت بۆ ئافرەتان ، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (الجلباب) پۆشاکێکە ڕوومەتیشی پێ دادەپۆشرێت.**

**جا پێشەوا (أبو عبد الحمن آبادي) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت لە (عون المعبود شرح سنن أبي داود) لە شرۆڤەی (كَشَفْنَاهُ) فەرموویەتی : ((واتا (الجلباب)مان لادەبرد ، وە (النقاب)یشمان هەڵدەگرت ، وە (الحجاب)یشمان وەلا دەنا)).**

**کەواتە لە ڕووی (شەرعەوە) هەر یەک لە (الجلباب) و (النقاب) و (الحجاب) یەک واتا و مەبەستیان هەیە کە بۆ پۆشینی ڕوومەتە.**

## بەڵگەی سێیەم /

**عن أسماء بنت أبى بكر رضي الله عنهما قالت : ((كنا نُغطّي وجوهَنا من الرجالِ))[٣١] .**

---

٣٠- (سنن أبي داود : ١٨٣٣ ، مشكاة المصابيح : ٢٦٩٠).

٣١- (رواه ابن خزيمة : ٢٠٣/٤ ، والحاكم : ٦٤٢/١ وصححه ووافقه الذهبي ، وصححه الألباني في الإرواء : ٢١٢/٢).

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (أسماء بنت أبی بکر) (ڕەزای خوایان لێبێت) کە فەرموویەتی : ((ئێمە ڕوومەتمان دادەپۆشی لە پیاوان)).

**بەڵگەی چوارەم /**

**عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ ، أَنَّهَا قَالَتْ : ((كُنَّا نُخَمِّرُ وُجُوهَنَا، وَنَحْنُ مُحْرِمَاتٌ، وَنَحْنُ مَعَ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ))[٣٢] .**

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (فاطمة بنت المنذر) کە فەرموویەتی : ((ئێمە ڕوومەتی خۆمانمان دادەپۆشی لە کاتێکدا کە لە (ئیحرام)ـدا بووین ، وە لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبو بەکری سدیقیشدا بووین)).

پێشەوا (السندي) لە (المنتقی شرح موطأ مالک) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی : ((وتەی (كُنَّا نُخَمِّرُ وُجُوهَنَا وَنَحْنُ مُحْرِمَاتٌ) مەبەستی ئەوەیە کە ڕوومەتیان دادەپۆشی بەبێ (النقاب) بە واتای داپۆشین ، چونکە (ئیحرام) ڕێگری لە پۆشینی (النقاب) دەکات ، هەروەها ئەو ئافرەتانە لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبو بەکر بوون کە خاوەن زانست و ئاین و شکۆ بووە ، جا ئەسمائیش زۆرییان لێ ناکات بۆ کارێک مەگەر بە ڕێگەپێدراوی بزانێت ، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەسماء داپۆشینی ڕوومەتی پێ دروست بووە لە (ئیحرام)ـدا ، وە یەکێکە لەو ئافرەتانەش کە دەبێ ئافرەتان چاوی لێ بکەن ، وە ڕەوایە ئافرەتان لە (ئیحرام)ـدا ڕوومەتیشیان داپۆشن بەو شێوازەی باسمان کرد کە پارچەیەک بخاتە سەر ڕوومەتی بۆ داپۆشینی لە چاوی بێگانە ، بەڵام ڕەوا نییە ڕوومەتی داپۆشێت لەبەر گەرما و سەرما ، ئەگەر وای کرد ئەوکاتە ئەبێ (فیدیە) بدات)).

کەواتە ئافرەتان لەسەردەمی پەیامبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕوومەتیان بەدەرەوە نەبووە و داپۆشراو بووە.

---

٣٢- (الموطأ : ٩١٩).

## بەڵگەی پێنجەم /

عن إسماعيل بن أبي خالد عن أمه قالت : ((كنا ندخل على أم المؤمنين يوم التروية، فقلت لها يا أم المؤمنين هنا امرأة تأبى أن تغطي وجهها وهي محرمة فرفعت عائشة خمارها من صدرها فغطت به وجهها))[٣٣].

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (إسماعيل بن أبي خالد) کە گێڕاویەتییەوە لە دایکی کە فەرموویەتی : ((ئێمە لە ڕۆژی (تەروییە) دەچووینە لای دایکی باوەڕداران ، جا پێم وت ئەی دایکی باوەڕداران ئافرەتێک لێرەیە ڕوومەتی داناپۆشێت کە لە (ئیحرام) دایە ، جا عائیشەش (الخمار)ـەکەی خۆی لابرد لەسەر سینگی و ڕوومەتی ئافرەتەکەی داپۆشی)).

## بەڵگەی شەشەم /

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ : ((فَعَرَفَنِي حِينَ رَآنِي وَكَانَ رَآنِي قَبْلَ الْحِجَابِ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِي، فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي))[٣٤].

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (عائشة)وە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((کاتێک (صفوان) بینیمی ناسیمیەوە چونکە پێش ئەوەی باڵاپۆشی پێویست (واجب) بکرێت ئەیبینیم ، لەو کاتەدا کە منی ناسییەوە و دەیوت (إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ) من لە خەو هەستامەوە و ڕوومەتم بە (الجلباب)ـەکەم داپۆشی)).

فەرموودەکە باسی ڕووداوی درۆهەڵبەستنەکەیە بۆ دایکمان عائیشە ، فەرموودەیەکی دوورودرێژە ، ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە باسەکەی ئێمەوە بڕگەی (فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي)ـە.

---

٣٣- (حسن رواه ابن أبي خيثمة ، التلخيص الحبير : ٢/٥٧٦).

٣٤- (البخاري : ٤١٤١).

## بەڵگەی حەوتەم /

عَن عَائِشَةَ قَالَتْ : ((لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّه (صَلَى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) يُصَلِّي الْفَجْرَ، فَيَشْهَدُ مَعَهُ نِسَاءٌ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ مُتَلَفِّعَاتٍ فِي مُرُوطِهِنَّ ، ثُمَّ يَرْجِعْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ مَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ)) [٣٥].

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (عائشة)وە کە فەرموویەتی : ((پەیامبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی بەیانی ئەکرد ، جا ئافرەتانی باوەڕداریش ئامادەی نوێژ دەبوون خۆیانیان بە پۆشاکەکانیان دادەپۆشی پاشانیش کە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان هیچ کەسێک نەیانی دەناسییەوە)).

لە هەندێک لە گێڕاوەکانی دیکە هاتووە (لَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الْغَلَسِ) واتە : (هیچ کەسێک نەیانی دەناسییەوە بەهۆی تاریک و ڕوونی بەیانییەوە).

زانایان زۆر شتیان وتووە لەسەر ئەم فەرموودیە هەندێکی لێرە دەگێڕمەوە بە ویستی خوا.

پێشەوا (ابن حجر) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت لە ڕاڤەی فەرموودەکەدا فەرموویەتی : ((قال الداودي: معناه لا يعرفن أنساء أم رجال، أي لا يظهر للرائي إلا الأشباح خاصة، وقيل لا يعرف أعيانهن فلا يفرق بين خديجة وزينب)) [٣٦].

واتە : ((داوودی فەرموویەتی : واتاکەی ئەوەیە نازانرێت ئەوانە ئافرەتن یان پیاون ، واتا بۆ بینەر هیچ دەرناکەوێت تەنیا کۆمەڵێک تارمایی تایبەت نەبێت ، وە وتراویشە چاوەکانیان نابینرێن بۆیە خەدیجە لە زەینەب جیا نەدەکرایەوە)).

---

٣٥- (البخاري : ٣٧٢)

٣٦- (فتح الباري : ٧٤/٢).

بەڵام پێشەوا (النووي) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((وهذا ضعيف لأن المتلفعة في النهار أيضا لا يعرف عينها))[٣٧].

واتە : ((وتەکەی داوودی لاوازە چونکە ئافرەتی (المتلفعة) لە ڕۆژیشدا چاوەکانی دیار نییە)).

وشەی (متلفعات) کۆیە ، تاکەکەی (متلفعة)یە ، داتاشراوەی وشەی (تَلَفَّعَ)ەیە کە بە واتای پێچایەوە و داپۆشی دێت ، جا کە ئافرەت بە ڕۆژیش چاوەکانی دیار نەبێت کەواتە پێچاویەتییەوە و داپۆشیوە ، چاویش چەقی ڕوومەتە ، هەر بۆیە پێشەوا (أبو عبد الرحمن آبادي) فەرموویەتی : ((متلفعات أي مستترات وجوههن وأبدانهن))[٣٨].

واتە : ((«متلفعات» واتا ڕوومەت و جەستەیان داپۆشراو بوو)).

وە یەکێک لە واتاکانی (المرط) کە لە فەرموودەکەدا هاتووە (مُرُوطِهِنَّ) واتای (الجلباب)ـە ، هەروەکو لە بەشی دووەمدا وتامان کرد بەوەی چارشێوێکە لە ئاوریشم یان خوری یان کەتان دروست دەکرێت ، بۆیە ئەو ئافرەتە باوەڕدارانە کە دەچوون بۆ نوێژی بەیانی بەو کەشە تاریک و ڕوونەش هەر (جلباب)یان دەپۆشی تاکو تەواوی جەستەیان داپۆشراو بێت بە ڕوومەتیشیانەوە ، لە کاتێکدا لەو کەشەدا بە تەواوی ڕوومەت دەرناکەوێت چونکە کەشەکە تاریک و ڕوونە بەڵام ئافرەتانی هاوەڵان هەر دەیانکرد بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا و پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

---

٣٧- (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج : ٢٨٠/٢).

٣٨- (عون المعبود : ٢٣٦/١ ، طبعة دار ابن حزم).

## بەڵگەی هەشتەم /

**قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : ((لَا تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلَا تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ))[39].**

**واتە : پەیامبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((ئافرەت کە لە (ئیحرام)دا با (النقاب) و (القفاز) نەپۆشێت)).**

**(النقاب) : لە ڕووی شەرع و زمانەوانییەوە ڕوونمان کردەوە ، بەڵام ئەوەی ماوەتەوە بڵێین : نیقاب بەو پارچەیە ئەوترێت کە دەدورێتەوە بە جیا بەبێ چارشێو ، تەنیا بۆ داپۆشینی ڕوومەت بەکار دێت.**

**(القفاز) : پارچەیەکە دەدورێتەوە تەنیا بۆ پۆشینی دەستەکان ، بە کوردیش دەستکێشی پێ ئەوترێت.**

**جا ئەم دوو شتە بۆچی یاساغی لێ کراوە لە کاتی (ئیحرام)دا ئەوە لە بەشی حەوتەم ڕوونی دەکەینەوە بە ویستی خوا ، بەڵام لێرەدا ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پۆشینی ڕوومەت و دەستەکان ، چونکە گەر ئافرەتان ڕوومەت و دەستیان دانەپۆشیبایە بۆچی پەیامبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی لە (ئیحرامدا) ئەو دوو شتە مەپۆش ؟! ، کەواتە ئافرەتان لەو دەمەدا ڕوومەت و دەستیان داپۆشراو بووە چونکە فەرمانی خوا و پەیامبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)یان جێبەجێ کردووە.**

---

٣٩- (البخاري : ١٨٣٨).

**بەڵگەی نۆیەم /**

**قَالَ رسولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : ((الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ ، وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ " اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ))[٤٠].**

**واتە : پەیامبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((ئافرەت تێکڕای جەستەی شەرمەندامە ، وە کاتێک دەچێتە دەرەوە شەیتان لە بەرچاوی پیاوان دەیڕازێنێتەوە )).**

**وشەی (العَوْرَة) لە زمانەوانیدا چەندان واتای بۆ کراوە کە گشتی دەگەڕێتەوە بۆ یەک مەبەست ، وەکو:**

**(كل مكمن للستر).**

**(هي كل ما يستحيا منه إذا ظهر).**

**(كل ما يستره الإنسان إستكنافا أو حياء).**

**بە پوختی و کورتی واتا گشت ئەو شوێنانەیە کە مرۆڤ دایدەپۆشێت تاکو بیپارێزێت یان جێگەی شەرمە و دەیشارێتەوە.**

**جا پەیامبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی : ((الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ)) ، ڕوومەت و دەست و پێیەکانی جیا نەکردۆتەوە ، چونکە تێکڕای جەستەی دەبێت داپۆشێت ، جا پێشەوا (ابن القيم) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((شەرمەندام دوو دانەیە : شەرمەندامی سەیرکردن ، وە شەرمەندامی نوێژ ، جا ئافرەتی ئازاد دەبێت بە ڕوومەت و دەست نەپۆشراوی نوێژ بکات ، بەڵام بۆی نییە لە ماڵ دەرچێت بۆ بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بەو جۆرە))[٤١].**

---

٤٠- (سنن الترمذي : ١١٧٣ ، الإرواء : ١/ ٢٧٣-٣٠٣).

٤١- (إعلام الموقعين : ٢/٨٠).

شێخ (حمود التويجري) فەرموویەتی : ((ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تێکڕای جەستەی ئافرەت شەرمەندامە لەبەرامبەر پیاوانی بێگانە ، جا ڕوومەتی یان ئەندامەکانی تری ، وە ئەبو تاڵیب دەگێڕێتەوە لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە فەرموویەتی : (دەرکەوتنی ئافرەت شەرمەندام (عورة)ـە ، جا کە لە ماڵ دەردەچێت نابێت هیچ ئەندامێکی بەدەرەوە بێت تەنانەت (خوف)ـەکانیشی چونکە (خوف) شێوازی پێیەکان دەردەخات ، وە پێشم باشە دەستی مشت بکات و دایپۆشێت تاکو هیچی لێ دەر نەکەوێت) ، وە ئیبن و تەیمیە دەگێڕێتەوە لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە فەرموویەتی : (تێکڕای جەستەی ئافرەت شەرمەندامە تەنانەت ڕوومەتیش) ، شێخی ئیسلام فەرمووی : (ئەمە وتەی مالکی کوڕی ئەنەسیشە)))[٤٢].

## بەڵگەی دەیەم /

قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) : ((مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ ، لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْه يَوْمَ الْقِيَامَةَ)) . فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ : فَكَيْفَ يَصْنَعْنَ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ ؟، قَالَ : ((يُرْخِينَ شِبْرًا)). فَقَالَتْ : إِذَنْ تَنْكَشِفُ أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ : ((فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعًا، لَا يَزِدْنَ عَلَيْه))[٤٣]

واتە : پەیامبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((هەر کەسێک پۆشاکەکەی شۆڕ بکاتەوە بە لوتبەرزییەوە ئەوا خوا لە دوارۆژدا سەیری ناکات)) ، ئوم سەلەمە فەرمووی : ئەی ئافرەتان چی بکەن بە شۆڕی پۆشاکەکانیان ؟ ، فەرمووی : ((با شۆڕی بکەنەوە)) ، ئوم سەلەمەش وتی : دەی پێییەکانی بەدەر دەکەون ، ئەویش فەرمووی : ((دەی با باڵێک شۆڕی بکەنەوە و لەوە زیاتری نەکەن)).

---

٤٢- (الصارم المشهور : ٩٦).

٤٣- (سنن الترمذي : ١٧١٣ ، صححه الألباني في صحيح الترمذي).

لەم فەرموودەیەدا فەرمان کراوە بە ئافرەتان بە داپۆشینی پێیەکانیان ، لێرەدا سێ پرسیار دێتە پێشەوە:

١- ئایا (زینة )ی ئافرەتان زیاتر لە ڕوومەتیانە یان لە پێیەکانیان ؟!.

٢- ئایا (تبرج)ی ڕوومەت مەترسی زیاترە یان پێیەکان ؟!.

٣- ئایا پۆشینی ڕوومەت لەپێشترە یان پۆشینی پێیەکان ؟!.

خۆی لە خۆیدا ئەو پرسیارانە ڕوون کردنەوە و گەیاندنی ئەوەیە کە پۆشینی ڕوومەت لە پێشترە لە پۆشینی پێیەکان ، چونکە ئایا (زینة )ی ئافرەتان زیاتر لە ڕوومەتیانە وەک لە پێیەکانیان ، وە (تبرج)ی ڕوومەت مەترسی زیاترە لەسەر ڕەگەزی بەرامبەر تاکو پێیەکان.

**بەڵگەی پانزەیەم /**

**قَالَ النَّبِيُّ (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : ((لَا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا ))[٤٤].**

واتە : پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((با ئافرەتان تێکەڵاوی یەکتر نەکەن تاکو باسی شێوەی بکات لای مێردەکەی وەکو ئەوەی سەیری بکات)).

**لێرەدا دوو بەڵگەی تێدایە بۆ پۆشینی ڕوومەت:**

١- ئافرەتانی پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵان ڕوومەتیان داپۆشیوە و بێگانە نەیانی بینیوە ، خۆ گەر ئافرەتان ڕوومەتیان دانەپۆشی بێت و هاوەڵانیش ئافرەتانی بێگانەیان بینیبێت لە پاش پێویست بوونی (الحجاب) بێگومان ، ئەوا چی پێویستی ئەکرد پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی بکردایە بە ئافرەتان کە باسی شێوەی ئافرەتانی بێگانە نەکەن لای مێردەکانیان ؟!.

---

٤٤- (البخاري : ٥٢٤٠).

٢- هەروەها خۆ گەر ئافرەتان ڕوومەتیان دانەپۆشی بێت و هاوەڵانیش ئافرەتانی بێگانەیان بینیبێت لە پاش پێویست بوونی (الحجاب) بێگومان ، ئەوا بڕگەی (كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا) هیچ سودێکی نەدەبوو بۆ وتنی ! ، چونکە خۆ دەتوانن بە چاوی خۆیان سەیر بکەن نەک بۆیان باس بکرێت ! ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئافرەتان ڕوومەت پۆش بوون بینینی ڕوومەت لە ئارادا نەبووە.

**بەڵگەی دوانزەهەم /**

عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ، قَالَ : أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ لَهُ امْرَأَةً أَخْطُبُهَا، فَقَالَ : ((اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا " فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا )).

فَأَتَيْتُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ فَخَطَبْتُهَا إِلَى أَبَوَيْهَا، وَأَخْبَرْتُهُمَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَأَنَّهُمَا كَرِهَا ذَلِكَ.

قَالَ : فَسَمِعَتْ ذَلِكَ الْمَرْأَةُ وَهِيَ فِي خِدْرِهَا.

فَقَالَتْ : إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَكَ أَنْ تَنْظُرَ فَانْظُرْ وَإِلَّا فَأَنْشُدُكَ.

كَأَنَّهَا أَعْظَمَتْ ذَلِكَ.

قَالَ : فَنَظَرْتُ إِلَيْهَا فَتَزَوَّجْتُهَا فَذَكَرَ مِنْ مُوَافَقَتِهَا ).[٤٥]

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (مغيرة بن شعبة) کە فەرموویەتی : هاتم بۆلای پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و بۆم باس کرد کە ئەمەوێت ئافرەتێک مارە بکەم ، ئەویش فەرمووی : ((بچۆ سەیری بکە چونکە چاکترە بۆ ئەوەی خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە)).

---

٤٥- (سنن ابن ماجه : ١٨٦٦ ، مسند أحمد : ١٨١٣٧).

منیش چووم بۆ لای ئافرەتێک لە پشتیوانان و داوام کرد لە باوکی ، وە وتەکەی پەیامبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ)یشم پێ ڕاگەیاند ، بەڵام وەک بڵێی پێیان ناخۆش بوو ،

وتی : ئافرەتەکە گوێی لەو ئاخاوتنانە بوو لە ژوورەکەی خۆیدا.

جا وتی : ئەگەر پەیامبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) فەرمانی پێ کردوویت سەیرم بکەی ئەوا بیکە گەرنا سوێندت ئەدەم بەخوا نەیکەی.

ئافرەتەکە ئەو سەیرکردنەی زۆر پێ قورس بوو.

وتی : منیش سەیرم کرد و هاوسەرگیریم لەگەڵیدا کرد و باسی پەسەند کردنەکەشی کرد.

**لێرەشدا سێ تێبینی دێتە پێشەوە:**

١- گەر ئافرەتانی پەیامبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) و هاوەڵان ڕوومەتیان بەدەرەوە بووبێت چۆن موغیرە چۆتە خوازبێنی و کچەکەی نەدیوە ؟! ، وە چۆن کچەکە و باوکیشی پێیان ناخۆشە موغیرە سەیر بکات ؟!.

٢- وەکو ئاماژەمان پێدا جوانی ئافرەت لە ڕوومەتی دایە ، وە بەسەیر کردنی ڕوومەت ئارەزووەکان دەجۆشێن ، هەر بۆیە پەیامبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی : سەیری بکە تاکو خۆشەویستی بکەوێتە نێوانتانەوە.

٣- ئەگەر ئافرەتان بە بەبێ داپۆشینی ڕوومەت لە ماڵەوە دەرچووبایەن ئەوا چی پێویستی ئەکرد موغیرە بچێت داوا لە باوکی کچە بکات تاکو سەیری بکات ، خۆ ئەیتوانی لە دەرەوە بیبینێت و سەیری بکات گەر ڕوومەتی دانەپۆشی بێت !.

## (مەترسییەکانی خۆدانەپۆشین)

لە پاش خستنەڕووی ئەو دەقانە کە بەڵگەن لەسەر پێویستێتی باڵاپۆشی بەو شێوازەی کە فەرمانی پێکراوە ئەنجا دێین باسی مەترسییەکانی خۆدانەپۆشین ئەکەین کە کۆمەڵێک هەڕەشەی توندی لەسەر هاتووە:

پەروەردگار فەرموویەتی : (وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ)[٤٦].

واتە : (وە ئەو پیرەژنانەی کە بێئومێد بوون لە هاوسەرگیری ئەوا تاوانبار نابن گەر هەندێک لە پۆشاکەکانیان لابەرن بەڵام بەبێ دەرخستنی جوانییان).

کەواتە ئەو ئافرەتانەی کە پیر نەبوونە و بێئومێد نەبوونە لە هاوسەرگیری و ئارەزووی ئەوەیان ماوە گەر تاراکەیان لابەرن و خەڵکی بێگانە بییان بینێت تاوانبار ئەبن.

بۆیە ئافرەتان گەر خۆیان بە تەواوەتی دانەپۆشن ئەوا تاوانبارن.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی : (وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى)[٤٧].

واتە : (وە جوانی خۆتان دەرمەخەن وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی پێشوو).

بۆیە دەرخستنی جوانی بۆ بێگانە نەریتێکە لە نەریتی بێباوەڕان کە نەزان و گەمژە بوون ، هەروەها خۆچوواندنیشە پێیانەوە کە لە تاوانە گەورەکانە.

---

٤٦- (النور : ٦٠).

٤٧- (الأحزاب : ٣٣).

پەیامبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی : ((صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا " قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا))[٤٨].

واتە : ((دوو چین لە خەڵکی ئاگر بە شێوازێک سزا ئەدرێن هەر نەم بینیوە ، خەڵکانێک قامچییان پێیە لە شێوەی کلکی مانگا پێی ئەدەن لە خەڵکی ، وە ئافرەتانێک کە داپۆشراوی ڕووتن ، گوێڕایەڵی خوا ناکەن و خەڵکی دیکەش فێری کردارەکانی خۆیان ئەکەن ، قژیان بە شێوازێک ئەپێچنەوە وەک بڵێی سمی وشترە و لار بۆتەوە ، ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە ، وە بۆنی بەهەشتیش ناکەن ، لە کاتێکدا بۆنی بەهەشت هێندەی ئەوەندە و ئەوەندە دەڕوات)).

**هەندێک لە دەستەواژەکان زیاتر لە واتایەک هەڵدەگرن بۆیە خاڵ بە خاڵ ڕوونیان دەکەینەوە:**

١- (كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ) / وتراوە : بەشێک لە جەستەی بەدەر دەخات بۆ دەرخستنی جوانی خۆی ، وتراویشە : پۆشاکێکی ناسک لەبەر دەکەن چۆنیەتی جەستەیان دەردەخات.

٢- (مُمِيلَاتٌ) / وتراوە : خەڵکی دیکەش فێری کردارەکانی خۆیان دەکەن ، وتراویشە : پرچی خەڵکی وەکو سۆزانییەکان شانە دەکەن.

٣- (مَائِلَاتٌ) / وتراوە : بە لوتبەرزییەوە ڕێ ئەکەن ، وتراویشە : پرچیان وەکو سۆزانییەکان لێ دەکەن بەوەی بەلایەکدا شانەی دەکەن ، وتراویشە : ویستیان بۆ لای پیاوانی بێگانە هەیە بە دەرخستنی جوانی خۆیان.

---

٤٨- (مسلم : ٢١٢٨).

**هەردوو وشەکەش پێکەوە وتراوە : گوێڕایەڵی خوا ناکەن ، کە گشت ئەو کردارانەی باس کران بریتییە لە گوێڕایەڵ نەبوونی خوا.**

**٤- (رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ) / واتا بە پەچە و لەچک سەریان دەبەستنەوە تاکو زل و گەورە ببێت ، وتراویشە : ئارەزوویان بۆ پیاوان ئەچێت و چاویان داناخەن تاکو نەیانبینن ، وە سەریشیان دانانەوێن.**

**٥- (لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ) / ئەوانەی کە ئەو کارە قەدەغە کراوانە بە ڕەوا (حلال) بزانن لە کاتێکدا ئەشزانن قەدەغەکراوە ئەوا کافرن و بۆ تاهەتایی لە ئاگرن ، وە ئەوانەی کە بە قەدەغەی ئەزانن بەڵام ئەنجامی ئەدەن خراپەکار و تاوانبارن ناچنە بەهەشتەوە تاکو لە ئاگردا نەسوتێنرێن و سزا نەدرێن.**

**پێشەوا (النووي) لە (المنهاج)دا فەرموویەتی : ((فەرموودەکە لە (موعجیزە)کانی پەیامبەرە ، چونکە ئەم هەواڵەی پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕوویداوە)).**

**پێشەوا (النووي) پێش (هەشت سەدە) وا بڵێت دەبێ ئێستا چۆن بێت !!! ، جا بۆیە ئەو بەناو (حیجاب)انەی کە تەسک و تروسکن یان کورت و تەنکن ، یان دەلکێن بەجەستەوە ، یان ناسکن ئەوانە (حیجاب) نین وە هەرکەسێک بیپۆشێت لە ڕووی شەرعەوە پێی ناوترێت باڵاپۆش بەڵکو پێی ئەوترێت (كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ) !.**

**پەیامبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((خَيْرُ نِسَائِكُمُ الْوَدُودُ الْوَلُودُ الْمُوَاتِيَةُ الْمُوَاسِيَةُ إِذَا اتَّقَيْنَ اللهَ ، وَشَرُّ نِسَائِكُمُ الْمُتَبَرِّجَاتُ الْمُتَخَيِّلَاتُ وَهُنَّ الْمُنَافِقَاتُ " لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْهُنَّ إِلَّا مِثْلُ الْغُرَابِ الْأَعْصَمِ))[٤٩].**

**واتە : ((باشترینی ئافرەتەکانتان ئەوانەن کە زۆر مناڵیان ئەبێت و زۆر خۆیان خۆشەویست ئەکەن لای مێردەکانیان ، زۆر بە باشی گوێڕایەڵی مێردەکانیان ئەبن ، ئەگەر سنورەکانی خواش بپارێزن ، وە خراپترینی ئافرەتەکانتان ئەوانەن کە**

---

٤٩- (سلسلة الصحيحة : ١٨٤٩).

جوانی خۆیان بۆ بێگانە دەردەخەن ، وە لوتبەرزن ، وە هاوشێوەی دووڕووەکانن ، ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە مەگەر وەکو قەلەڕەشی قاچ سپی نەبێت)).

تەماشەکەن پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی ئافرەتانی دانەپۆشراو ئەکات بە خراپترین ئافرەت ، وە ئەفەرمێ ناشچنە بەهەشتەوە مەگەر وەکو قەلەڕەشی قاچ سپی نەبێت ! ، ئایا کەس قەلەڕەشی قاچ سپی بینیوە ؟! ، بۆیە ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بۆ ئەو ئافرەتانەی خۆیان دانا پۆشن بە پۆشاکێکی شەرعی ئیسلامییانە هاشێوەی پۆشاکی ئافرەتانی پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵان.

عَن عَبدُالله بنُ عَمرو بنُ عاص قال : جَاءَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَقَالَ : ((أُبَايِعُكِ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكِي بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقِي، وَلَا تَزْنِي، وَلَا تَقْتُلِي وَلَدَكِ، وَلَا تَأْتِي بِبُهْتَانٍ تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ يَدَيْكِ وَرِجْلَيْكِ، وَلَا تَنُوحِي، وَلَا تَبَرَّجِي تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى))[٥٠].

واتە : دەگێڕدرێتەوە لە (عَبدُ الله بنُ عَمرو بنُ عاص) کە فەرموویەتی : (ئومەیمەی کچی ڕوقیقە) هاتە لای پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تاکو پەیمانی پێ بدات لەسەر ئیسلام ، جا پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی : ((پەیمانم پێ بدە کە هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێیت ، وە دزی نەکەیت ، وە داوێنپیسی نەکەی ، وە منداڵەکەت نەکوژیت ، وە گەر منداڵێکت لێ بوو بەهۆی تاوانی داوێنپیسییەوە نەیدەیتە پاڵ مێردەکەت ، وە شیوەن نەکەیت ، وە جوانی خۆت دەر نەخەیت وەکو سەردەمی نەزانی پێشوو)).

سەرنج بدەن موسڵمانان تاوانی جەستە دەرخستن چەندە تاوانێکی قێزەونە ! ، بەشێوازێک قێزەونە کە لەگەڵ ئەو تاوانە قێزەونانە باسکراوە.

---

٥٠- (مسند أحمد : ٦٨٥٠).

**جا پێویستە دایکان و خوشکان خۆیان داپۆشن وەکو خێزانەکانی پەیامبەر (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) و هاوەڵان ، نەک بە (مۆدێل)ی تورکی و ئێرانی !.**

## (شێوازی باڵاپۆشی و مەرجەکانی)

لە پاش گشت ئەو دەقانەی باسکران سەرەنجام دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە باڵاپۆشی چییە و چۆنە و دەشبێت چۆن و بە چی شێوازێک بێت ، ئەمەش زانایانمان لە کۆمەڵێک خاڵدا ڕێکیان خستووە کە پێی ئەوترێت مەرجەکانی باڵاپۆشی.

جا خاڵ بە خاڵ ئەم مەرجانە باس دەکەین هاوتا لەگەڵ هۆکارەکانی بە گەڕانەوە بۆ دەقەکان:

مەرجی یەکەم/ پێویستە تەواوی جەستە داپۆشێت ، بە بەڵگەی ئایەتی : (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ) [٥١].

واتە : (چارشێوەکانیان شۆڕ بکەنەوە بەسەر تێکڕای جەستەیان).

وتیشمان (جَلَابِيب) کۆی (الجلباب)ـە کە بەو پۆشاکە ئەوترێت کەلە تەوقی سەرەوە تاکو پێیەکان داپپۆشێت بەبێ دەرکەوتنی هیچ بەشێکی جەستە ، وە ئەو هەموو دەقانەی هێنامانەوە گشتی بەڵگەن لەسەر داپۆشینی تێکڕای جەستە بە ڕوومەت و دەستەکانیشەوە.

مەرجی دووەم / پێویستە ناسک نەبێت ، بەبەڵگەی فەرموودەی : ((وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ ))[٥٢].

کە یەکێک لە واتاکانی ئەوە بوو پۆشاکێکی ناسک لەبەر دەکەن چۆنیەتی جەستەیان دەردەخات.

مەرجی سێیەم / پێویستە تەسک نەبێت ، بە بەڵگەی ئایەتی : ( وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ) [٥٣].

---

٥١- (الأحزاب : ٥٩).   ٥٢- (مسلم : ٢١٢٨).   ٥٣- (النور : ٣١).

گەر پۆشاک تەسک بێت و بلکێت بە جەستەوە بێگومان جوانی لەش و لار بەدەر دەخات ، بەڵکی بەو جۆرە سەرنج ڕاکێشترە تاکو بە ڕووتی !.

مەرجی چوارەم / پێویستە تەنک نەبێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی (أسامة بن زيد) کە فەرموویەتی : پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پۆشاکێکی کەتانی تەنکی پێ دام ، منیش دام بە هاوسەرەکەم ، پاشان کە بینیمی وتی ئەوە بۆ پۆشاکەکەت لەبەر نەکردووە ، منیش وتم دام بە هاوسەرەکەم ، ئەویش فەرمووی : ((مُرْهَا، فَلْتَجْعَلْ تَحْتَهَا غِلَالَةً، إِنِّي أَخَافُ أَنْ تَصِفَ حَجْمَ عِظَامِهَا))[٥٤].

واتە : ((زوو پێی بڵێ با پۆشاکێک لە ژێرییەوە بپۆشێت ، چونکە ئەترسم ئەو پۆشەکە شێوەی جەستەی دەربخات)).

کەواتە پۆشاکی تەنک قەدەغەیە بۆ ئافرەتان ، جا تەنکێکە بکەوێتە هەر بەشێکی جەستەوە.

مەرجی پێنجەم / پێویستە کورت نەبێت ، بەبەڵگەی فەرموودەی : إِذَنْ تَنْكَشِفُ أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ : ((فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعًا، لَا يَزِدْنَ عَلَيْهِ))[٥٥].

واتە : دەی پێیەکانی بەدەر دەکەون ، ئەویش فەرمووی : ((دەی با باڵێک شۆڕی بکەنەوە و لەوە زیاتری نەکەن)).

نابێت بە هیچ شێوازێک کورت بێت و پێیەکان بەدەر بکەون.

---

٥٤- (مسند أحمد : ٢١٧٨٦).

٥٥- (سنن الترمذي : ١٧١٣ ، صححه الألباني في صحيح الترمذي).

**مەرجی شەشەم / پێویستە هاوشێوەی پۆشاکی پیاوان نەبێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی : ((لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ، وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ))[٥٦].**

**واتە : ((پەیامبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) نەفرینی کردووە لە پیاوێک پۆشاکی ئافرەت بپۆشێت ، وە لە ئافرەتێکیش پۆشاکی پیاو بپۆشێت)).**

**مەرجی حەوتەم : پێویستە هاوشێوەی پۆشاکی بێباوەڕان نەبێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی : ((تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ))[٥٧].**

**واتە : ((هەر کەسێک خۆی چوواند بە خەڵکانێکەوە ئەوا لەوانە)).**

**مەرجی هەشتەم / پێویستە بە بۆنەوە نەبێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی : ((أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ، فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ))[٥٨].**

**واتە : ((هەر ئافرەتێک بۆن لە خۆی بدات و بە پێشی بێگانەکاندا تێپەڕێت تاکو بۆنی بکەن ئەوا ئافرەتێکی داوێنپیسە)).**

**مەبەست لە داوێنپیسی بریتییە لە داوێنپیسی چاو (زنى العين)ـە ، چونکە بەو بۆنەی ئارەزووی ڕەگەزی بەرامبەر دەجۆشێنێت بۆیە سەیری دەکات ، بەوەش بۆتە هۆکار بۆ ئەوەی چەندان پیاو توشی داوێنپیسی چاو ببن بە سەیر کردنی ، وەکو چۆن پەیامبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی : ((فَالْعَيْنَانِ زِنَاهُمَا النَّظَرُ))[٥٩]**

**واتە : ((جا داوێنپیسی چاوەکان سەیرکردنی بێگانەیە)).**

---

**٥٦- (سنن أبي داود : ٤٠٩٨).**

**٥٧- (سنن أبي داود : ٤٠٣١).**

**٥٨- (سنن النسائي : ٥١٢٦).**

**٥٩- (مسلم : ٢٦٥٧).**

مەرجی نۆیەم / پێویستە سەرنج ڕاکێش نەبێت ، ئەمەش بەوەی خشڵ و زێڕەکانیان لەسەر پۆشاکەکانیانەوە دانێن ، چونکە پێشەوا (الطبري) لە شرۆڤەی ئایەتی (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) ـدا فەرمووی : ((ئەوەیە کە دیار نییە ، بەڵکو شاراوەیە ، وەکو پاوەن و گوارە و قوڵبەند))[٦٠].

هەروەها پێشەوا (ابن عباس) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی : ((ئەو جوانییەی کە بۆیان هەیە دەری بخەن بۆ ئەو کەسانە (مەحرەمەکانی خۆی) : گوارە و ملوانکە و بازنگەکانیانە ، بەڵام پاوەند و قۆڵبەند و مل و قژی دەری ناخات بۆ هیچ کەسێک تەنیا مێردەکەی خۆی نەبێت))[٦١].

بۆیە نابێت پۆشاک سەرنج ڕاکێش بێت بە خشڵ و زێڕ بڕازێنرێتەوە ، هەروەها هەندێک پولەکە و (تەترِیز)یش کە زەق و سەرنج ڕاکێشن نابێت بەکار بهێنرێن.

مەرجی دەیەم / پێویستە پۆشاکی ناسراوێتی نەبێت ، بە بەڵگەی فەرموودەی : (( مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ ))[٦٢].

واتە : ((هەر کەسێک پۆشاکێک بپۆشێت بۆ خۆ دیاری کردن ئەوا لە دواڕۆژدا خوا پۆشاکی سەرشۆڕی لەبەری دەکات)).

پۆشاکی خۆ دیاری کردن (لباس الشهرة) ئەوەیە کە کەسێک پۆشاکێکی جیاواز لە هی خەڵکی لەبەر بکات تاکو شانازی پێوە بکات و پێوەی خۆی بە گەورە پیشان بدات ، جا زانایان فەرموویانە جیاوازییەکە چی لە ڕووی ئەوە بێت کە پۆشاکەکەی گران بەها بێت یان پۆشاکی سواڵکەران بێت بۆ خۆ دەرخستن بە شێوازی مەبەست هەمووی دەیگرێتەوە.

---

٦٠- (تفسير الطبري).

٦١- (تفسير الطبري).

٦٢- (سنن ابن ماجه : ٣٦٠٦).

**بۆیە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر قەدەغە بوونی ئەو پۆشاکانەی کە لە وڵاتانی بێباوەڕانەوە هاوردە دەکرێن بەناوی (مۆد)ەوە ، چونکە جیاوازن لە پۆشاکی باوەڕداران و کەسێک بیپۆشێت دەناسرێتەوە بەو پۆشاکەی.**

**بۆیە پۆشاکی شەرعی ئافرەتان : ئەو پۆشاکە فراوانەیە کە لە تەوقی سەریانەوە تاکو پێیەکان دادەپۆشێت ، وە ئەستور و درێژە ، وە هاوشێوەی پۆشاکی پیاوان و پۆشاکی بێباوەڕان نییە ، وە بەبۆن بۆنە و پۆشاکێکی خۆ دیاری کردنیش نییە ، وە سەرنج ڕاکێش نییە.**

## (ڕوونكردنەوەی چەند بابەتێكی پەیوەست)

لەم باسەدا كۆمەڵێک پرسی پەیوەست بە بابەتەكەوە دەخەینەڕوو وە شەن و كەوی دەكەین بە ویستی خوا.

### بابەتی یەكەم / ئایەتی (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا):

پەروەردگار فەرموویەتی : (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ)[٦٣].

واتە : (با ئافرەتانی باوەڕدار جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی خۆی بەدەر كەوتووە ، وە با پێچە و لەچكەكانیان شۆڕ بكەنەوە و بیدەن بەسەر سینگ و ملیاندا).

هەندێک ئەڵێن (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) واتا پۆشینی ڕوومەت و دەستەكان پێویست (واجب) نییە ، بەڵكو سوننەتە چونكە (ابن عباس) فەرموویەتی : ((مەبەست پێی ڕوومەت و دەستەكانە)).

لە وەڵامدا ئەڵێین : ئەم وتەیەی (ابن عباس) هەر یەک لە (ابن أبي حاتم) و (البيهقي) و (إسماعيل القاضي) دەریان هێناوە ، پێشەوا (المنذري) فەرموویەتی : ((لە سەنەدەكەیدا سەعیدی كوڕی بەشیر و ئەبو عەبدولڕەحمانی نەسڕی هەیە كە لە دیمەشق ماوەتەوە ، خزمەتكاری بەنی نەسڕ بووە ، بەشێک لە زانایان شتیان لەسەری وتووە))[٦٤].

---

٦٣- (النور : ٣١).

٦٤- (عون المعبود شرح سنن أبي داود : ١٨٧٣/٢).

کەواتە لە سەنەدەکەیدا کێشە هەیە ، ئەکرێ (ابن عباس) وای فەرموو بێ ئەشکرێ وای نەفەرمووبێ ! ، گەر وای نەفەرمووبێ ئەوا ئیتر دەبێ واز بهێنرێت لەم بۆچوونە ، ئەگەریش وای وتبێت دەی خۆ هەر (ابن عباس)یشە ئەفەرمێ : ((خوا فەرمانی کردووە بە ئافرەتانی موسڵمانان کە ڕوومەتی خۆیان داپۆش بە چارشێوەکانیان کاتێک لە ماڵەکانیان دەردەچن بۆ پێویستییەک))[٦٥].

وە شرۆڤەی ئەو ئایەتەشمان دانا لە بەشی سێیەم کە دایکە عائیشە شرۆڤەی دەکات بە ((فَاخْتَمَرْنَ بِهَا)) ، وە (ابن حجر) فەرموویەتی : ((وتەی (فَاخْتَمَرْنَ بِهَا) واتا ڕوومەتیان پێی داپۆشی))[٦٦].

ئەنجا ئەو (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا)یە چەندان شرۆڤەی تری بۆ کراوە ، هەر پێشەوا (ابن عباس) خۆی بە تەنیا چەندان بۆچوونی هەبووە وەکو:

١- پۆشاک : ئەمەش بۆچوونی (ابن مسعود)ـە ڕەزای خوای لێبێت ، وە بۆچوونی (حسن البصري) و (وابن سيرين) و (وأبو الجوزاء) و (إبراهيم النخعي) و جگە لەمانیشە.

٢- ڕژێنی چاو و مستیلە : ئەمەش بۆ چوونێکی (ابن عباس)ـە (ڕەزای خوای لێبێت).

٣- ڕژێنی چاو و گۆنا : ئەمەش بۆ چوونێکی تری (ابن عباس)ـە (ڕەزای خوای لێبێت).

٤- ڕوومەت و ڕژێنی چاو و خنەی دەست و مستیلە : ئەمەش بۆ چوونێکی تری (ابن عباس)ـە (ڕەزای خوای لێبێت) ، وە بۆ چوونی (مجاهد)یشە.

---

٦٥- (تفسير الطبري) و (تفسير ابن كثير).

٦٦- (فتح الباري : ٨/٦٢١).

٥- ڕوومەت و دەستەکان : ئەمەش بۆچوونی (سعيد بن جبير) و (عطاء) و (الأوزاعي) و (الضحاك) و (حسن البصري)ـە.

٦- ڕژێنی چاو و بازنگ و مستیلە : ئەمەش بۆچوونی (قتادة) و (المسور بن مخرمة)یە.

٧- سەرووی مەچەک و مستیلە و ڕژێنی چاو : ئەمەش بۆچوونێکی تری (قتادة)ـەیە ، وە بۆچوونێکی تری (ابن عباس)یشە.

ئەم گشت شرۆڤەیەی بۆ کراوە ، وە ئەو بەشەی ئایەتەکە واتای زۆر بەدەستەوە دەدات ، بەڵام دوابەدوای ئەو بەشە خوای گەورە باسی (الخمار) دەکات کە فەرموویەتی : (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ).

واتای ئەم بەشەی ڕوون و ڕەوانە ، جا پێویستە موسڵمان ئایەتە (متشابهات)ـەکان بگەڕێنێتەوە بۆ لای ئایەتە (محكم)ـەکان ، بە دەقی (محكم) باسی (الجلباب) و (الحجاب) و (الخمار)مان کرد ، وە بە دەیان فەرموودەمان لەسەر داپۆشینی ڕوومەت هێنایەوە ناکرێ بۆ خۆ دەرکردن لەو دروشمە گەورەیە هانا ببرێتە بەر دقە (متشابهات)ـەکان !.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) ، خۆ نەیفەرمووە (إِلَّا مَا أظْهَرَ مِنْهَا) ، چونکە (إِلَّا مَا أظْهَرَ مِنْهَا) واتا (ئەوەی خۆی دەری دەخات) ، بەڵام (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) واتا (ئەوەی خۆی بەدەر کەوتووە) ، ئەوەشی کە خۆی بەدەر کەوتووە پۆشاکەکەیە ، بۆیە بۆچوونەکەی (ابن مسعود) و هاوبۆچوونەکانی پێکراوە . الله اعلم ..

هەروەها بەشێک لە زانایان فەرموویانە ئەو وتەیەی (ابن عباس) مەبەستی پێی ئەوەیە کە لە پێش دابەزینی پێویست کردنی (الحجاب) داپۆشینی ڕوومەت و دەست پێویست نەبووە.

ئەمەش لە ڕاستیدا بۆچوونێکی بەهێزە چونکە لە شرۆڤەی ئایەتی : (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ) پێشەوا (انس بن مالک) (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی : ((کاتێک زەینەب درا بە پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خواردنێکی دروست کرد و خەڵکی بانگهێشت کرد ، ئەوانیش هاتن لەو کاتەدا زەینەب لە ماڵەوە بوو لەگەڵ پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، دەستیان کرد بە گفتوگۆی خۆیان ، وە پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەردەچوو وە دەگەڕایەوە ژوورەوە ئەوانیش دانیشتبوون ، ئەنجا ئایەتەکە دابەزی ، ئەوانیش هەستان و پەردەیەکیان لە نێوان خۆیان ، زەینەب دانا))[٦٧].

وە دایکمان عائیشەش فەرمووی : ((کاتێک (صفوان) بینیمی ناسیمیەوە چونکە پێش ئەوەی باڵاپۆشی پێویست (واجب) بکرێت ئەیبینیم))[٦٨].

بۆیە لە سەرەتادا باڵاپۆشی تەنیا پۆشینی جەستە بووە بەبێ ڕوومەت و دەست ، پیاوان ڕوومەتی ژنانیان ئەبینی ، دواتر خوای گەورە فەرمان ئەکات ژنان ڕوومەتیشیان داپۆشن.

هەر بۆیە پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە سەرەتادا ڕێگەی بە ئافرەتان دابوو ڕوومەت و دەستیان بەدەر بخەن وەکو دایکمان (عَائِشَةَ) دەگێڕێتەوە کە ئەسمائی خوشکی پۆشاکێکی ناسکی لەبەر بوو پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یش فەرمووی : ((يَا أَسْمَاءُ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا))[٦٩].

واتە : ((ئەی ئەسماء ئافرەت کە پێگەشت بۆی ڕەوا نییە هیچ بەشێکی جەستەی ببینرێت تەنیا ئەمە و ئەوەی نەبێت)).

---

٦٧-(تفسیر الطبري).

٦٨- (البخاري : ٤١٤١).

٦٩- وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ. (سنن أبي داود : ٤١٠٤).

دایکمان عائیشە فەرمووی : ئاماژەی کرد بە ڕوومەت و دەستی.

ئەمە لە پێش پێویست (واجب) بوونی ڕوومەت و دەست داپۆشین بووە ، چونکە دواتر وەکو ڕوونمان کردەوە خوای گەورە بە ئایەتی (الحجاب) فەرمان دەکات ئافرەتان ڕوومەت و دەستیان داپۆشن.

هەروەها ئەم فەرموودەیە دایکمان عائیشە دەیگێڕێتەوە ، وە باسەکەش باسی ئەسمائی خوشکێتی ، کەچی هەردووکیان ڕوومەت پۆش بوونە وەکو لە فەرموودەکان هاتوون و ئاماژەشمان پێدان.

ئەمە و جگە لەوەی کۆمەڵێک لە زانایان فەرموودەکە (وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ) بە لاواز دادەنێن بەهۆی پچڕان لە سەنەدەکەیدا.

جا باسەکە با ناکۆکی زانایانیشی لەسەر بێت ، ئەی خۆ لە ناکۆکیشدا چارەسەر هەیە ، پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ))[٧٠].

واتە : ((واز بێنە لەو شتەی کە گومانت بۆ دروست دەکات بچۆ بۆ ئەوەی گومانت بۆ دروست ناکات)).

وە فەرموویەتی : ((وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ))[٧١].

واتە : ((هەر کەسێک بکەوێتە ناو گومانەکانەوە ئەوا کەوتۆتە ناو قەدەغە کراوەکانەوە)).

---

٧٠- (سنن الترمذي : ٢٥١٨).

٧١- (مسلم : ١٥٩٩).

**کەواتە بابەتەکە لە دوو بەرداشت دەرناچێت:**

**بەرداشتی یەکەم : ئەگەر هاتووە ڕوومەت پۆشین (واجب) بێت ، ئەوا ئەو ئافرەتانەی کە کردوویانە خوای پەروەردگار پاداشتیان دەداتەوە لە بری جێبەجێ کردنی (واجب)ێک لە (واجب)ـاتی ئیسلام ، وە خۆشیان لە سزای خوا و قەدەغە کراوێکی ئیسلامیان پارستووە بەو ڕوومەت داپۆشینیان.**

**بەڵام ئەوانەی کە ڕوومەتیان داناپۆشن توشی تاوانێک هاتوون وە شایەنی سزای خوای گەورن.**

**بەرداشتی دووەم : ئەگەر هاتوو ڕوومەت پۆشین سوننەت بێت ئەوا دیسانەوە خوای پەروەردگار پاداشتیان دەداتەوە لە بری جێبەجێ کردنی سوننەتێک لە سوننەتەکانی ئیسلام.**

**کەواتە لە هەردوو بارەکەدا ڕوومەت پۆشان قازانج ئەکەن ، بەڵام ڕوومەت نەپۆشان لە بارێکدا زیانبار دەبن چونکە گەر (واجب) بێت ئەوا تاوانبار دەبن و شایەنی سزای خوا دەبن ، وە گەر سوننەتیش بێت لە پاداشتەکەی بێ بەشن.**

**وە زانایان فەرموویانە (الخروج من الخلاف مستحب) ، واتا خۆ قوتار کردن لە ناکۆکی نێوان زانایان خوازراوە ، بۆیە پۆشینی ڕوومەت و دەستەکان خۆ قوتار کردنە لەو ناکۆکییە ، وە گەڕانەوەیە بۆ دەقە ڕوون و (محکم)ـەکان ، وە جێبەجێ کردنی کار و پیشەی خێزانەکانی پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و هاوەڵانە.**

**بابەتی دووەم / فەرموودەی (لَا تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ):** **خەڵکانێک ئەڵێن گەر پۆشینی ڕوومەت پێویست (واجب)ـە ئەی بۆچی بۆ (ئیحرام) پێویست نییە و پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((ئافرەت کە لە (ئیحرام)ـدا بوو با تارا و دەستکێش ناپۆشێت)).**

**بە سێ خاڵ وەڵامی ئەم گومانە ئەدەینەوە بە ویستی خوا:**

خاڵی یەکەم : سەرەتا ئەم فەرموودەیە خۆی بەڵگەیە لەسەر پێویستی پۆشینی ڕوومەت چونکە ئافرەتان لەو دەمەدا ڕووپۆش بوون ، هەربۆیە ئەفەرمێت با لە (ئیحرام)ـدا با ڕوومەتیان بە (النقاب) و دەستیشیان بە (القفاز) نەپۆشن ، خۆ گەر ڕووپۆش نەبوونایە ئەوا وتنی ئەم فەرموودیە چی سودێکی ئەبوو !!!.

خاڵی دووەم : پاشان یاساغییەکە بەند (مقید)ـە بە (الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ) ، واتا ئەو ئافرەتەی کە لە ئیحرام دایە با ڕوومەتی بە (النقاب) و دەستەکانی بە (القفاز) نەپۆشێت ، ئەی ئەوانەی لە (ئیحرام) نین ؟! ، بێگومان بۆیان هەیە بەو دوو پۆشاکەش بپۆشن.

خاڵی سێیەم : یاساغییەکە لەسەر پۆشینی (النقاب) و (القفاز)ـە نەک لەسەر پۆشینی ڕوومەت و دەست ، واتا یاساغی کراوە لە پۆشینی دوو جۆر لە پۆشاک نەک لەسەر پۆشینی ئەندامەکە.

پێشەوا (ابن القیم) فەرموویەتی : ((پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕێگەی نەداوە بە ئافرەتان ڕوومەتیان بەدەر بخەن لە کاتی (ئیحرام) و جگە لەو کاتەش ، بەڵکو دەق بە تایبەتی لەسەر (النقاب) هاتووە ، هەروەکو چۆن لەسەر دەستکێش هاتووە ، وە هەروەکو چۆن یاساغی لەسەر پۆشینی کراس و شەواڵ هاتووە ، جا زانراویشە کە یاساغییەکی پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە پۆشینی ئەم شتانە مەبەست پێی بەدەر خستن نییە بێگومان ، بەڵکو یەکدەنگی موسڵمانانی لەسەرە کە پیاو پێویستە خۆی بە (الرداء) و (الإزار) داپۆشێت لە (ئیحرام)ـدا ... ، جا چۆن زیادە ئەخەنە سەر مەبەستی دەقەکە و وا تێدەگەن لە دەقەکە کە پەیامبەر (صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕێگەی داوە بە ئافرەتان ڕوومەتیان بەدەر بخەن لە نێو ئەو خەڵکە ؟! ، کامە دەق وای لێ دەخوێنرێتەوە ؟! ، یان بە کام تێگەشتن و کام دەقی گشتگیر و کام (قیاس) و کام بەرژەوەندی ؟! ، بەڵکو ڕوومەتی ئافرەت وەکو جەستەی پیاوە ، قەدەغەیە لە (ئیحرام)ـدا ڕوومەتی

داپۆشێت بە پۆشاکی جیاکراوە وەکو (النقاب) و (البرقع) ، هەروەها دەستەکانیشی قەدەغەیە بە پۆشاکی جیاکراوە داپۆشێت وەکو (القفاز) ، بەڵام پۆشینی ڕوومەت بە (الخمار) و (الثوب) لە دەرەوە بێگومان یاساغی لێ نەکراوە)) [٧٢]

وە شێخ (ابن باز) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((واتای (لَا تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلَا تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ) ئەو پۆشاکەیە کە پارچەیە و بڕاوە و دووراوەتەوە بۆ داپۆشینی ڕوومەت وەکو (النقاب) ، وە بۆ داپۆشینی دەستەکان وەکو (القفاز) ، مەبەست پێی ئەوە نییە کە ڕوومەت و دەستەکانی نەپۆشێت وەکو چۆن هەندێک وا گومانیان بردووە ، جا بۆیە پۆشینی ڕوومەت و دەست پێویستە بەڵام بەبێ (النقاب) و (القفاز))) [٧٣].

جا (النقاب) و (القفاز) دوو پارچەی جیاکراوەن لە پۆشاکی جەستە ، وە دوو پارچەی دووراوەن ، وە قەتیسن ، بۆیە یاساغی کراوە لە پۆشینی ئەو دوو پۆشاکە نەک دەرخستنی ڕوومەت ، بەڵکو پێویستە ڕوومەت و دەستەکانیش داپۆشراو بن لە (ئیحرام)دا بەڵام بە (الجلباب) داپپۆشرێن نەک بە (النقا) و (القفاز) چونکە (الجلباب) یەک پارچەیە نییە کە چارشێوە.

ئەمەش هەر وەکو بابەتەکەی پیاوانە کە چۆن پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یاساغی کردووە لە پۆشینی کراس و شەواڵ لە کاتی (ئیحرام)دا ، خۆ ئەمە واتای ئەوە نییە پیاوان بە ڕووت و قوتی بەبێ کراس و شەواڵ بسوڕێنەوە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو پۆشاکانە نابێت بپۆشن لە (ئیحرام)دا چونکە جیاکراوەن و دووراونەتەوە و پارچەن قەتیسن بۆ بەندایەتی ناشێت لە (ئیحرام)دا ، بۆیە لە بری ئەوە دەبێت (الرداء) و (الإزار) بپۆشن.

---

٧٢- (بدائع الفوائد : ٦٦٤/٢- ٦٦٥)

٧٣- (مجموع فتاوى ابن باز : ٢٢٣/٥).

پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی : ((لَا تَلْبَسُوا الْقَمِيصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْ أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا شَيْئًا مَسَّهُ زَعْفَرَانٌ، وَلَا الْوَرْسُ، وَلَا تَنْتَقِبِ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلَا تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ))[٧٤].

واتە : ((كراس و شەواڵ و پێچە و (البرانس) مەپۆشن ، هەر کەسێکیش سۆڵی پێ نەبوو با (خوف) لە پێ بکات ، وە با خوارەوەی قاپەڕەقی (خوفەکە) ببڕێت ، وە شتێک مەپۆشن کە (زعفران) و (ورس)ی لێ درابێت ، وە ئافرەتیش (النقاب) و (القفاز) نەپۆشن)).

ئەمانە کۆمەڵێک ڕێنمایی پەیامبەری خوان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ ئەوانەی دەچن بۆ حەج و عەمرە ، کە تایبەتیشن بە حەج و عەمرەوە بە تەنها ، بۆیان نییە ئەو پۆشاکانە بپۆشن لە کاتی بەستنی (ئیحرام).

(البرانس) : پۆشاکێکە لە سەری شانەکانەوە تاکو کەمەر دادپۆشێت و لە سەریشەوە پارچەیەکی پێوەیە وەکو کڵاو بۆ داپۆشینی سەر.

(زعفران) : ڕووەکێکە بۆ بۆنخۆشکردنی خۆراک و جەستە و پۆشاکیش بەکاریان دەهێنا.

(ورس) : ڕووەکێکە لە ناوچەکانی عەرەب دەڕوێت ، بۆ ڕەنگ کردنی پۆشاک بەکاریان دەهێنا.

جا پۆشینی (النقاب) و (القفاز) ڕەوا نییە بۆ ئافرەتان لە کاتی (ئیحرام)ـدا ، بەڵام پێویستە ڕوومەت و دەستیان بە جگە لەو دوو پۆشاکە بپۆشن هەروەکو چۆن دایکمان عائیشە و کۆمەڵێک ئافرەتی دیکە لەگەڵ پەیامبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

٧٤- (البخاري : ١٨٣٨).

ـدا بوون لە (ئیحرام)ـدا ڕوومەتیان دادەپۆشین کاتێک پیاوان ڕووبەڕوویان ببوونایەتەوە ، هەروەکو چۆن دایکمان عائیشە بە (الخمار)ـەکەی ڕوومەتی ئافرەتێکی داپۆشی لە (تەروییە)ـدا ، وە هەروەکو چۆن (فاطمة بنت المنذر) فەرمووی : ((ئێمە ڕوومەتی خۆمانمان دادەپۆشی لە کاتێکدا کە لە (ئیحرام)ـدا بووین ، وە لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبو بەکری سدیقیشدا بووین)).

بۆیە ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ڕوومەت و دەستەکانی ئافرەتان لە کاتی (ئیحرام) و جگە لە (ئیحرام)یش هەر (عورة) شەرمەندامن پێویستە داپۆشرێن ، بەڵام لە (ئیحرام)ـدا نابێت ڕوومە بە (النقاب) و دەستەکانیش بە (القفاز) داپیۆشرێت ، بەڵکو بە (الجلباب) و (الخمار) دایدەپۆشن کە یەک پارچەیە و کوت و لەت و دوراو نییە وەکو (النقاب) و (القفاز) پێچە و کراس و شەواڵ و پانتۆڵ و کڵاو و هاوشێوەکانیان !.

## بابەتی سێیەم / دانەپۆشینی ڕوومەت و دەستەکان لە کاتی نوێژدا.

ئەم بابەتەش باس دەکرێت پێم باش بوو بە پوختی و کورتی ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەم.

زانایان فەرموویانە لە نوێژدا سوننەت وایە ئافرەتان ڕوومەت و دەستیان بەدەرەوە بێت ، بەڵام بەو مەرجەی بێگانە نەیبینێت ، واتا گەر لە شوێنێک بوو وەکو لە مزگەوتی حەرام یان مەدینە کە زۆر جار تێکەڵاوی ڕوو دەدات گەر زانییان ئەکەونە پێش چاو بێگانە ئەوا پێویستە داپپۆشن ، بەڵام لە ماڵی خۆی یان لە شوێنێک بێگانە نەیبینێت سوننەت وایە ڕوومەت و دەستیان دەربخەن.

شێخ (ابن باز) بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت فەرموویەتی : ((سوننەت وایە ئافرەت ڕوومەتی دەربخات لە نوێژدا ئەگەر بێگانە لەوێدا نەبوو))[٧٥].

---

٧٥- (فتاوى المرأة المسلمة : ٥٧).

وە لە (فتاوى اللجنة الدائمة : ٢٤٨/٧) هاتووە کە فەرموویانە : ((دەرخستنی ڕوومەت لە نوێژدا سوننەتە ئەگەر بێگانە لەوێدا نەبوو)).

وە شێخ (صالح الفوزان) پەروەردگار بیپارێزێت فەرموویەتی : ((ئافرەت تێکڕای جەستەی شەرمەندامە بۆیە پێویستە تەواوی جەستەی داپۆشێت لە نوێژدا تەنیا ڕوومەتی نەبێت گەر بێگانە لەوێدا نەبوو ، جا ئەگەر لەو شوێنەدا کەس نەبوو یان بێگانە نەبوو ڕوومەتی دەردەخات لە کاتی نوێژدا ، بەڵام گەر پیاوی بێگانەی لێ بوو ئەوا ڕوومەتی دادەپۆشێت لە کاتی نوێژ و کاتەکانی تریش چونکە ڕوومەتیش شەرمەندامە))[٧٦].

بابەتی ڕوومەت پۆشین شتێک نییە تایبەت بێت بە لایەنێکی دیاری کراو بەڵکو دروشمێکە لە دروشمەکانی ئیسلام ، وە یەکێکە لە بەندایەتییە گەورە و مەزنەکان ، تایبەت نییە بە سەلەفی و فڵان و فیسار ، ئەمە فەرمانی خوای پەروەردگارە بۆ تێکڕای ئافرەتانی باوەڕدار.

زانا و بانگخوازانی (مەزاهیب) و لایەنەکانی دیکەش لە سەرە گەورەکانی پێڕەکان هەبووە ڕوومەت پۆشینیان پێ پێویست بووە ، بۆ نمونە (الحافظ جلال الدين السيوطي) کە سۆفی بووە لە شرۆڤەی ئایەتی (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) فەرموویەتی : ((ئەم ئایەتە بەڵگەی پۆشینی سەر و ڕوومەتی تێدایە))[٧٧].

وە (عبدالله الشرقاوي) شێخی ئەزهەر وتوویەتی : ((شەرمەندامی ئافرەت لە دەرەوەی نوێژ کە بێگانەیەک سەیری بکات ئەوا تێکڕای جەستەی تەنانەت ڕوومەت و دەستەکانیشی شەرمەندامن))[٧٨].

---

٧٦- (فتاوى المرأة المسلمة : ٣١٥/١).

٧٧- (الإكليل في استنباط التنزيل : ٢١٤).

٧٨- (حاشية الشرقاوي على تحفة الطلاب بشرح تنقيح اللباب : ١ /١٧٤).

وە (عبدالحليم محمود) شێخی ئەزهەڕ وتوویەتی : ((پێویستە ئافرەت ڕوومەت و دەستەكانیشی بپارێزێت بۆ داخستنی دەرگای خراپەكاری))[79].

وە زۆری تر وەكو (سعيد رمضان البوطي) كە سۆفی بووە ، وە (الكوثري) كە ئەشعەری بووە ، وە (داماد افندي حنفي) كە حەنەفی مەزهەب بووە ، وە (ابن العربي المالكي) كە مالكی مەزهەب بووە ، وە زۆری تر لە زانایان و بانگخوازان و كەسە ناودار و ناسراوەكانی مەزهەب و پێڕەكان ڕوومەت پۆشینیان پێ پێویست بووە.

بۆیە پرسی ڕوومەت داپۆشین بابەتێكی تایبەت نییە بە لایەنێكی دیاری كراوەوە ، بەڵكو بەندایەتییەكە لەو بەندایەتییانەی خوای گەورە پێویستی كردووە لەسەر ئافرەتانی باوەڕدار.

اللهم هل بلغت اللهم فاشهد.

---

٧٩- (مجلة صوت العرب "بيروت" كانون الثاني ١٩٦٧).

# پێرست